**پێناسەی قوربانی:** قوربانی بریتییە لەو ئاژەڵەی کە سەردەبڕدرێت لە ڕۆژەکانی جەژندا، بۆ نزیکبوونەوە لە الله تعالى، بەچەند مەرجێکی تایبەت، قوربانی کردنیش بە قورئان و سوننەت و کۆدەنگی جێگیرە.

**حوکمی قوربانی:** جەماوەری فەقیهان لەسەر ئەوەن کە قوربانی کردن سوننەتێکی جەخت لێکراوە، ئەوەش مەزهەبی شافیعی وئەحمەد ومالیکە لەوەی کە بەناوبانگە لێیەوە و مەزهەبی ئیبن حەزمی زاهیریشە، بەشێکیش بۆ ئەوە چوون کە قوربانی کردن پێویستە لەسەر ئەوەی دەتوانێت بیکات، ئەوەش مەزهەبی ئەبوحەنیفە ولەیث وئەوزاعی ومالیکە لە وتەیەکیدا، ئەوەش هەڵبژاردەی شێخی ئیسلام ئیبن تەیمیەیە.
ڕاسترینیش -والله أعلم- وتەی جەماوەرە، ئەوەیە کە سوننەتێکی جەخت لێکراوە بۆ ئەوانەی کە دەتوانن بیکەن.

**مەرجەکانی قوربانی:** چوار مەرجی سەرەکی بۆ قوربانی کردن دانراوە:
١. **ئەوەیە کە لە ماڵاتەکان بێت:** ماڵاتەکانیش ئەمانەن: حوشتر وڕەشەوڵاخ ومەڕو بزن(غنم)، لە هەندێك ناوچەشدا ناوی غەنەم هەر بە مەڕ دێت بەتەنها.
٢. **گەیشتبێت بە ساڵی دیاریکراوی شەرعی خۆی:** بەوەی کە کاوڕێکی مەڕ بێت، یان چێشتیر لە بێجگە لەو، جا چێشتیر لە حوشتردا: ئەوەیە کە پێنج ساڵی تەواو کردبێت، چێشتیر لە ڕەشەوڵاخدا ئەوەیە کە دوو ساڵی



تەواو کردبێت، چێشتیر لە مەڕو بزندا ئەوەیە کە نیو ساڵی تەواو کردبێت، قوربانی کردنیش بەبێ بوون بە چێشتیر لە حوشتر و ڕەشەوڵاخ و بزندا دروست نییە، هەروەها لە مەڕیشدا کە نەبووبێت بە کاووڕ دروست نییە.
٣. **ئەوەیە کە هیچ نەنگییەکی تێدا نەبێت:** نەنگیش کە قوربانییەکەی پێ ڕەد دەکرێتەوە چوارە: پێغەمبەر ﷺ باسی کردووە: چوار ئاژەڵ بۆ قوربانی دەست نادەن: کوێرێك کە کوێرێتییەکەی دیاربێت، نەخۆشێك کە نەخۆشییەکەی دیاربێت، شەلێك کە شەلییەکەی دیار بێت، لاتێك کە قەڵەو نەبێتەوە. (صحيح، أبوداود وبێجگە لەو گێڕاویانەتەوە)، کۆمەڵێك نەنگی تر دەبەسترێنەوە بەم چوارەوە کە لە وێنەی ئەوانن یان توندترن ، لەوانە کوێرێك کە هەر نابینێت، ئاژەڵێك کە دەستێك یان قاچێکی بڕابێتەوە، هەڵئاوسێنرابێت ، بێ توانا بێت لە ڕۆیشتن ...هتد .
ئینجا هەندێك نەنگی هەیە لە قوربانی کردندا کەراهەتی هەیە بەڵام دروستە ، وەکو گرانی گوێ، قۆچ شکاوی، هەندێك لە کلکی بڕدرابێت، ئەوەشی کە هەندێك لە ددانەکانی کەوتبێت ...هتد.

٤. **ئەوەیە کە موڵکی قوربانیکەرەکە بێت یان ڕاسپێردرا بێت لەلایەن خاوەن قوربانییەکەوە:** بۆیە دروست نییە کەسێك قوربانی بکات کە خۆی خاوەنی قوربانییەکە نەبێت، وەکو بەزۆر لێ سەندراو یان دزراو یان وەرگیراو بە داوای بەتاڵ وهەروەها، چونکە الله پاکە پاکیش نەبێت وەرناگرێت، دروستنیش نییە کە خۆتی بە تاوان لێ نزیك بکەیتەوە.



**ئەوەی کە لە قوربانی کردندا خۆشویستراوە:** خۆشویستراوە ئاژەڵێك هەڵبژێردرێت کە زۆرترین گۆشتی پێوە بێت پتەو بێت جوان بێت، لە ئەبوئومامەی کوڕی سەهلەوە رضي الله عنه وتوویەتی: ئێمە قوربانییەکانمان لە مەدینە قەڵەو دەکرد وموسڵمانانیش وایان دەکرد.(البخاري)، جەماوەری فەقیهان بۆ ئەوە چوون کە چاکترین قوربانی: حوشترە پاشان ڕەشەوڵاخە پاشان مەڕە پاشان بزنە، مالکییەکانیش دەڵێن: چاکترینیان مەڕە پاشان ڕەشەوڵاخە پاشان حوشترە، بەپێی خۆشی گۆشتەکەی، فەقیهانیش دەفەرموون: قوربانی کردن لە نێر (پتەوبێت) چاکترە لە مێ.

**ئەوانەی کە هاوبەشییان تێدا دەکرێت لە قوربانیدا:** قوربانییەك لە مەڕو بزن هاوبەشی تێدا دەکرێت بۆ پیاو وماڵ ومناڵەکەی و ئەوەشی دەیەوێت لە موسڵمانان، حەوت یەکی(١/٧) حوشترێك یان حەوت یەکی ڕەشەوڵاخێك، بەو شێوەیەی کە یەکێکی لێ هاوبەش دەکەیت لە مەڕو بزنەکە، بەو مانایەی کە یەك حوشتر یان یەك ڕەشەوڵاخ حەوت کەس تیایدا بەشدارە، هەر کەسێکیان قوربانی بۆ خۆی وخاوخێزانەکەی کردووە.
**کاتی قوربانی:** هەموو زانایان یەکدەنگن لەسەر ئەوەی کە قوربانی دروست نییە سەر ببڕدرێت پێش نوێژی جەژن لە ڕۆژی جەژنی قورباندا، کاتی قوربانی کردنیش درێژ دەبێتەوە لە دوای نوێژی جەژنەوە هەتا کۆتایی سێ ڕۆژ دوای ئەوە.

مكتبة الهمّة

دەوڵەتی ئیسلامی

ذو الحجة 1437 ک

# قوربانی



جیاکردنەوە لە قوربانییەکە و سوود وەرگرتن لێی: دروستە بۆ قوربانیکەر کە لە قوربانییەکەی بخوات وبیدات بە دیاری وبیبەخشێتەوە، زانایان ڕاجیان لەسەر ئەندازەی ئەوەی کە دەخورێت و دەکرێت بە دیاری و دەبەخشرێتەوە، شتەکەش لێرەدا فراوانە، بەڵام ئەوە هەڵبژێردراوە کە سێیەکی بخورێت و سێیەکی بکرێت بەدیاری و سێیەکی ببەخشرێتەوە ، ئەوەی کە دروستە لێی بخورێت دروستیشە لێی هەڵبگیرێت مەگەر ساڵی برسێتی بێت ئەو کاتە دروستنییە لێی هەڵبگیرێت.. حەرامیشە کە هەرشتێکی قوربانییەکە بفرۆشرێت نە گۆشتەکەی نە هیچ شتێکی تری، هەتا پێستەکەشی، دروستیش نییە کە هیچ شتێکی بدرێت بە قەصابەکە لە بەرانبەر کرێ یان بەشێك لە کرێکە، چونکە ئەوە مانای فرۆشتن دەگرێتەوە.

ئەوەی کە دەبێت قوربانیکەر لێی دوور بکەوێتەوە: ئەگەر موسڵمانێك ویستی قوربانی بکات و چووە مانگی ذ الحجة وە ئەوە لەسەری حەرام دەبێت کە هیچ شتێك لە قژی بگرێت و نینۆکی ببرێت وپێستی لێبکاتەوە هەتا قوربانییەکەی سەر دەبڕێت، کاتێك نییەتی قوربانییەکەی هێنا لە میانەی ئەو دە ڕۆژەدا دەست دەگرێتەوە لە کردنی ئەو شتانە لەکاتی نییەت هێنانەکەیەوە، جا ئەگەر بە ئەنقەست لێی کردەوە ئەوە پێویستە تەوبە بکات، هیچ کەفارەتێکیشی لەسەر نییە، ئەگەر شتێکی لەوانە لێکردەوە لەبیری چوو بۆوە یان نەیدەزانی یان بە بێ مەبەست وای کردبوو، ئەوە هیچ تاوانی لەسەر نییە، ئەگەر



پێویستیشی بەوەبوو کە لێیان بکاتەوە ئەوە با لێی بکاتەوە و هیچی لەسەر نییە، وەکو ئەوەی کە نینۆکی شکابێتەوە وئازاری بدات ئەو کاتە دەیبڕێت، یان پێویستی بە کورتکردنەوەی قژی هەبێت بۆ چارەسەر کردنی برین وەهەروەها.. داناییش لەو ڕێگری کردنەدا ئەوەیە کە قوربانیکەر بەشداری لەگەڵ حاجییەکاندا دەکات لە هەندێك لە کارەکانی قوربانیکردن دا، ئەوەش نزیکبوونەوەیە لە الله تعالى بە سەربڕینی قوربانییەکە، هەروەها بەشدار دەبێت لە هەندێك تایبەتمەندی ئیحرام، هەر لە لێ نەگرتنی قژ و هەروەها.

ئەو ئەحکامانەی کە پەیوەندییان هەیە بەو قوربانییەوەی کە دانراوە بۆ قوربانی کردن: ئەگەر قوربانییەك دانرا بۆ قوربانی کردن کۆمەڵێك ئەحکامی پێوە پەیوەست دەبێت، لەوانە ئەوەیە کە ناتوانرێت مامەڵەی پێوە بکرێت بەکرین وفرۆشتنی یان بەخشینی یان بارمتەدانان لە جیاتی، هەروەکو کە دروست نییە سواری بێت وبەکاری بهێنێت بۆ زەوی کێڵان مەگەر بۆ باری پێویست بێت و زەرەری بەر نەکەوێت، دروستیش نییە کە هیچ شتێك لە خورییەکەی لێ بکرێتەوە مەگەر ئەوەی کە بەسوودترە بۆ ئاژەڵەکە کە لێی بکرێتەوە، ئەگەر قوربانیکەریش مرد پێویستە لەسەر میرات گرەکانی ئەو قوربانییەی بۆ بکەن کە دایناوە ،...هتد.

یا الله قوربانی قوربانیکەران وەربگرێت و لەسەر ئەوانەشی ئاسان بکەیت کە ناتوانن بیکەن

وصلِّ اللّهمَّ وسلّم على نبيِّنا محمَّد، وعلى آله وصحبه أجمعين